کورتە باسێک دەربارەی ...

# سەلاحەدین ئەیوبی






ئامادەکراوە لە لایەن ماڵپەڕی سانا

بابەتێکی مێژوویی یە

بەدیزاینی کلاسیکی

ساڵی 2014-2015

ناوی : یوسف نە جمە دین ئە یوب

لەساڵانی 1137-1197ژیاوە

لەساڵی 1178قودسی ڕزگارکرد

Website:www.sana23kurd.wordpress.com
sanakurd.net
http://www.facebook.com/sana.kurd23
www.twitter.com/sanakurd23
http://www.youtube.com/sana23tube

# ژیانی سەڵاحەدینی ئەیوبی

## پێشەکی




سەرکردەی مەزنی کوردو قارەمانی حەتین و رزگارکەری قودس ناوی یوسف نەجمەدین ئەیوب-ە نازناو بە پادشای رزگارکەرو ناسراو بەسەلاحەدینی ئەیوبی ساڵی (٥٣٢)کۆچی و (١١٣٧) زاینی لەخێزانێکی کورد و بنەماڵەیەکی بەرێزو خاوەن پێگەی مەزن لەدایکبووە.

سەلاحەدین موسڵمانێکی سوننی مەزهەب و سۆفی یەکی سەر بەرێبازی قادری و فەرماندەی سەربازی و دامەزرێنەری دەوڵەتی ئەیوبی یەو ئەشعەری بووە.

خێزانەکەیان دەگەڕێتەوە بۆسەر هۆزێکی کوردی بەناوی (روادی) ئەویش دەگەڕێتەوە سەر (ايوب بن شازي) باوکی کە لە گوندێکدا دەژیان بەناوی (دوین)ەو لەسنوری ئازەربایجان لەناوچەی هەزەبانیە کە بە گەورەترین هۆزی کوردی دێتە ئەژمار، هەندێ لەمێژوونووسان خێزانەکەی سەلاحەدین دەگەڕێننەوە سەر زنجیرەی باوانی کە بە (موزر) کۆتایی پێدێت و ئەویش سەر بە عەدنانی باپیرە گەورەی پێغەمبەرە (د.خ). هەندێک لە مێژوو نووسان بنەماڵەکەیان دەگەڕێننەوە سەر خەڵکی (دوین)ی ئەرمینیا.

وەکو منداڵێکی میریی لە خوێندنی سەردەمی خۆی بەهرەمند بوو و سوودی لە زانایانی ئەوکاتە وەرگرت، سەرەتا لەمزگەوتەوە وانە ئاینییەکانی وەک بیروباوەڕو قورئان و فەرموودەو هتد .. دواتر زمان و لۆژیکیشی خوێندوەو قورئانی لەبەر کردوەو حەزی لە شیعریش کردوەو لە فیقهیشدا دەستی باڵای هەبوە.

تەمەنی منداڵی و لاوێتی لەشاری بەعلەبەک و دیمەشق بەسەر بردووە، ساڵی (١١٦٤)ز لە یەکەم هێرشی شێرکۆی مامی دا بۆسەر میسر بەشداری کردوەو پاش سێ ساڵ و لەدووەم هێرشدا لەوێ جێگیر دەبێ. پاش دووساڵی تر واتە (١١٦٩)ز پاش مردنی شێرکۆی مامی دەبێتە وەزیری میسریی. ساڵی (١١٧١) کۆتایی دێنێت بەدەوڵەتی فاتیمی و دەبێتە فەرمانڕەوایەکی رەها لەو ولآتەدا، تا ئەوەی خزمەتێکی کەم وێنەی بەوڵآت و گەلەکەی پێشکەش کرد، پاش دوو ساڵ و پاش مردنی (نورەدین زەنكي) ولآتی (شام)یشی دەخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە. لەوە بەدواوە دەوڵەتێکی ئیسلامیی فراوان دادەمەزرێنی کە هەریەک لە میسرو شام و کوردستان و یەمەن و سودان و ناوچەکانی باکوری ئەفریقا لەخۆ دەگرێت و دیمەقیش دەکات بە پایتەخت و تێیدا کارباری وولآتی رێکخست.

کاتێک دەوڵەتی ئەیوبی دامەزران هەریەکە لە دورگەی شام و نیوەدورگەی عەرەبی و وولآتی تورکیاو عێراق و هتد... ی لەخۆگرتبوو.

ساڵی (١١٧٨) لەشەڕی (حەتین)دا پاش دووهێرشیاندا خاچ پەرستەکان تێکدەشکێنێت و شاری قودس و ناوچە داگیرکراوەکانی تر رزگار دەکات. لەگەڵ ئەو هەموو لێهاتووییەشیدا بەردەوام بەبەزەیی و لێبوردە بووەو بەرامبەر دوژمنانی بە هەڵوێستە مەزنەکانی هەموانی سەرسام کرد بوو و بوو بوویە جێی سەرنج.

هۆکاری سەرکەوتنی سەلاحەدین لەشەرو بەڕێوەبردنی ولآتدا لەخواترسان و رەزامەندی خواو ئامادەسازی جەنگیی بوو بۆهێرش و بەرەنگاربوونەوەو بەرژەوەندی ولآتی دەویست و لەبەر موسڵمانان و بەرنامەی ئیسلام دەیکۆشا.

بەم دواییانە تورکیا بەبەشداری (٥٠) وولآت کۆنگرەیەکی لەبارەی سەلاحەدینی ئەیوبی یەوە بەست تەنانەت ئیسرائیلیش ساڵی (١٩٨٧) کۆنگرەیەکی لەبارەوە بەست، زانکۆی تکریتیش ساڵی (٢٠٠٠) ئەو رۆژەی تەرخان کرد بۆیادی ئەو کەڵەپیاوەو رۆڵە مەزنەی.

شایانی باسە سەلاحەدین (٥) کوڕی هەبووە..

سەرەنجام ساڵی (٥٨٩)کۆچی و(١١٩٣)زاینی بە نەخۆشی کۆچی دوایی دەکات و لە مزگەوتی ئەمەوی لە سوریا نێژرا ئێستاش گڵکۆکەی هەر لەوێ یە.

# ژیانی سەلاحەدینی ئەیوبی

## ( صلاح الدين )کێ یە

### ڕەچەڵەك و پێگەیشتنی

ناوی: (یوسف بن أیوب بن شاذی) ناسراو بە میرنشینی سەرخەر (الملك الناصر صلاح الدين)، هەروەها بانگیان دەكرد بە (أبو المظفر ).
هەموو مێژوونووسان لەسەر ئەوە ڕێکن کە باوك و کەسوکاری لە کوردی ناوچەی (دوێن)ن، کە شارۆچکەیەکە لە ئەوپەڕی ئازەربیجان و لە کوردی ڕوادیەن، ڕوادیەش تیرەیەکن لە (هوزبانی) کە هۆزێکی گەورەی کوردەکانە لەو ناوچەدا .
مێژوونووسی کورد ئەحمەد کوڕی خەلەکان دەڵێن :
پیاوێکی شارەزا لە ئایین و خاوەن زانست کە خۆی خەڵکی شارۆچکەی (دوێن)ە پێی ووتم کە لە پێش چوونە ناو شارۆچکەکەوە گوندێك هەیە پێی دەوترێت: (ئەجدانقان) و هەموو دانیشتوانی ئەم گوندە کوردی ڕوادیەن، شازی یان (شاذی) کە دەبێتە باپیرەی (صلاح الدين) دەستی هەردوو کوڕەکەی بەناوی (شێرکۆ) و (ئەیوب)ی گرت وبەرەو بەغداد کەوتنە ڕێ و لە تکریت جێگیر بوون و هەر لەوێ (شاذی) وەفاتی کرد و لەسەر گۆڕەکەی گومەزێکی بۆ دروستکرابوو لەناو شارەکە .
صلاح الدين کە ناوی خۆی (یوسف)ە لە ساڵی (١١٣٨ ز - ٥٣٢ی ك) لەدایك بووە لەناو قەڵای تکریت لەو کاتەی باوکی و مامی لەوێ نیشتەجێ بوون و پاش لەدایکبوونی صلاح الدين بەماوەیەکی کەم قەڵاکەیان بەجێ هێشتووە، دیارە لەکۆتایی هەمان ساڵ یان لەسەرەتای ساڵی (١١٣٩ز - ٥٣٣ ك) تکریتیان بەجێ هێشت و لەلای عیمادالدین زەنگی نیشتەجێ بوون لە موسڵ، وە کاتێك عیمادالدين چەند ناوچەیەکی شامی گەمارۆ دا وەکو (دیمەشق) و پاشان (بەعلەبەك) و ڕزگاری کردن لەو کاتەدا (ایوب)ی کردە فەرمانڕەوای شاری (بەعلەبەك

ئەحمەدی ئیبن خەلەکان دەڵێت :
پرسیارم کردووە لە چەندەها کەس لەناو بنەماڵەی صلاح الدين کە ئایە دەزانن کەی لە تکریت کۆچیان کردووە بەرەو موسڵ؟ ئەوانیش وەکو بیستویانە لە بنەماڵەی خۆیان دەڵێن کە لەو شەوەی تیایدا صلاح الدين لەدایك بووە کۆچیان کردووە، بۆیە پێی شووم بوون، بەڵام هەندێکیان ووتیان بەشکو شووم نەبێت و بەپێچەوانەوە چاکەو خێری پێوە بێت و پێی نازانن.. ئیتر هەر ئەوەبوو خواش دەزانێت .

صلاح الدين بەو شێوەیە لە دیمەشق نیشتەجێ بوو لەگەڵ باوکی و تاکو تەمەنی لاوێتی بری، لە ساڵی (٥٤١ك) پادشا عمادالدين کوژرا لە قەڵای (جعبر) بەڵام ایوب و شێرکۆ مانەوە لە خزمەت کوڕی پادشا بەناو محمود ناسراو بە (نورالدين) دەسەڵاتداری دیمەشق و حەلەب، ئەویش ڕێزێکی زۆری لێ گرتن، لێرەدا ایوب لەقەبی خۆی دانا بە (نجم الدين) و شێرکۆ بە (اسد الدين) و یوسف بە (صلاح الدين ).
بۆیە لەو کاتەی نورالدين کوڕی عیماد الدين زەنگی بووە پادشای دیمەشق نجم الدين (ئەیوب) بەردەوام لە حزمەتیدا بوو لەگەڵ کوڕە لاوەکەی صلاح الدين کە هەر لەو کاتەوە نیشانەی دڵگەشی و چاکێتی پێوە دیاربوو و لە بارێکەوە بۆ بارێکی باشتر و بەرزتر سەردەکەوت و پادشا نورالدين نازی پێ دەدا و پێشی دەخست و ڕێزی بەرزی لێ دەگرت، هەر بۆیە صلاح الدين لەوەوە فێری چاکەکردن بوو لەگەڵ ئیجتیهادکردن لەکارباری جیهاد و بەرگری لەسەروەری موسڵمانان. هەر لە دیمەشق پێگەیشت و وانەکانی فیقە و فەرموودەو زانستی خوێند لەسەر دەستی زانا پایە بەرزەکانی ئەوێ و پاشان خوێندنەکەی لە قودس و میسر تەواو کرد



صەلاحەدینی ئەیوبی دوای ئەوەی توانی هەموو شام ومیسر وکوردستان وبرقیە و نەجد وجزیرەی نیوە دورگەی عەرەبی ویەمەن هەمووئەمانە یەك بخاتەوە ،خۆی ئامادەکردو بانگەشەی جیهادی کرد ،چونکە ماوەی ٨٨ بۆ ١٠٠ ساڵێك دەبێت خاکی قودس داگیرکراوە، مزگەوتی قودس کراوە بەتەویلەی ئاژەڵ و موسڵمانان لێیان قەدەغەکراوە ،زۆربەی زۆری موسڵمانان دەربەدەرکراون هەمووخەڵکی مەسیحی لەو جێگایانەدا نیشتە جێ کراون بەتایبەت لە (صور ،رەها ،بیت المقدیس،غەززە و ئەناطاکیە) لەهەموو ئەوناوچانەی تر کەبەدرێژای ١٠٠ساڵە داگیرکراوە ..ئەوموسڵمانانەشی کەتێیدا ماونەتەوە هەموو نۆکەری صەلیبی یەکان بوون.

لەوکاتەدا ناوچەیەك هەبوو لەنێوان میسر وشام وبوصرادا کەپێی دەوترا (کرك)پادشاکەی صەلیبی بوو بەناوی (ئەرناط) باجی زۆر زۆر کردبوو لەسەردەمی صەلاحەدینی ئەیوبی دا لەساڵی ٥٨٢کۆچی =١١٨٦ز ئەرناط پەیمانێك مۆردەکات لەگەڵ صەلاحەدین دا کە دەبێت بەهێمنی وئاسایشی وئەوپەڕی ڕێزەوە کاروانە ئیسلامی یەکان بپارێزن -دەنا.. ژیانت دەکەوێتە مەترسی یەوە ،ئەرناط ی بەرپرسی کرك ڕێزی لە صەلاحەدین گرت و هەموویان پێکەوە پەیمانەکەیان مۆرکرد.



سەبارت بە هۆکارەکانی بۆچوونی جیاواز هەیە هەندێ دەڵێن ئەرناط کەکاروانێکی بازرگانی گەورەی ئەیوبی یەکان لەوڵاَتی میسر ەوە ئاراستەکرابوو بەرەو حیجاز وشام زۆر لوت بەرزانە دەست دەگرێت بەسەر کاروانەکەدا کەزەرەرو زیانێکی گەورەی بەئابووری میسر گەیاند بوو،ئەمە لەلایەك ..هەروەها کرداری بازرگانی نێوان میسر وشام وحیجازی پەککخست، وەهەندێکی دیکە پێ یان وایە صەلاحەدینی ئەیوبی دوای نەخۆش کەوتنی لە ٥٨٢کۆچی= ١١٨٦ز پەیمانی ئەوەدەدات بە موسڵمانەکان کەئەگەر بێت ولەتەمەندا بمێنێت خۆی تەرخان باکت بۆلێدانی دوژمنانی موسڵمانان (صەلیبی یەکان). هەروەها لەباری بارودۆخە سیاسی یەکەو بڕینی هەردوو قۆناغی بەرگری وئامادەباشی لەلایەن سوڵتان صەلاحەدینەوە ،وەبەدیهێنانی ئامانجە سەرەکی یەکانی کەخۆی دەبینی یەوە لە دروستکردنی دەسەلاَتێکی سیاسی لەچوار چێوەی دەسەلاَتی خەلافەت ورزگار کردنی شاری قودس وەگێڕانەوەی دەسەلاَتی خەلافەت وهەوڵ دان بۆ بەدیهێنانی یەکێتی دەوڵەتی ئیسلامی سەرتاسەری، هەتا مێژوونوسان دەڵێن کاتێك دەستی گرت بەسەر کاروانەکەدا خاوەنی کرك قسەی ناشرینی بە ئیسلام وە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وتووە وە هەر هەموویانی بەدیل گرتووە ،وە ئەو کاروانەش هی خودی بنەماڵەی صەلاحە دین بوو واتا دائیرەی دەولە صەلاحە دین بوو بۆ میسر دەگەڕایەوە بۆ بیت المال کە زیاتر ئابووری میسر ببوژێنێتەوە.

صەلاحە دین کەهەواڵەکەی بیست کە بەو شێوەیە قسەی بەئیسلام وتووە صەلاحەدین کێشەی لە کاروانەکەدا نەبوو ،بەڵام کێشەی لەوەدا بوو کە قسەی بە ئیسلام وپێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) کردووە ،ئەوە بوو زۆر توڕە بوو توڕەبونێك بە جۆرێك مێژوونوسان دەڵێن: صەلاحە دین لە ژیانی دا ئەوەندە توڕە نەبووە وە سوێندی خوارد ئەگەر بە دیلیش بیگرێت بەدەستی خۆی دەیکوژێت ،دوای ئەم رووداوە کەڕووی دا صەلاحەدینی ئەیوبی ئارامی نەماو هەست وسۆزی جوڵاَ بۆ بەرامبەر خاك و وڵاتی موسڵمانان و بەرامبەر بە پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم)بەرامبەر صەلیبی یەکان بۆیە بانگەشەی جیهادی کردووخەڵکی کۆکردەوە بۆ جیهاد کەبۆخۆی صەلاحەدین ماوەیەکە بەدرێژای مێژوو چاوەڕێ ی ئەم ساتە وەختەیە کەهەر لەوسەردەمەی کەسەرۆکی پۆلیسی دیمەشق بووە لەسەردەمی عیمادە دین زەنگی دا خۆی بۆ ئامادەکردووە وئامانجی ئەوە بووە کە چۆن بتوانێت قودس ڕزگار بکات کەئەوە لەدوای ئەوە ئیستاش ئێمە شانازی پێوە دەکەین ،صەلاحەدینی ئەیوبی بیری لەوەکردوەتەوە چۆن خاکی موسڵمانان ڕزگار بکات لەدەستی فرەنجە وە چۆن بتوانێت عیزەت وسەربەزی ئەم ئیسلامە بهێڵێتەوە ،ئەوە بوو صەلاحەدینی ئەیوبی موجاهیدان و سوپاکەی لە هەمووولایەکەوە کۆکردەوە،وەناردی بەشوێن هەموو ئەمارەتەکاندا ،بۆئەوەی بانگەوازی جیهاد بکرێت و خەڵك بچێت بەرەو جیهاد ،صەلاحەدین زۆر بێزار بوو بەرامبەر بە ئەرناط وە بەدەوری شارو قەلعەکانی کرك دا سوپای خۆی دانا وگەمارۆی دا بۆ ئەوەی بچێتە ئەو جێگایەوە ،وەسەربازگەی دانا لەشوێنێك کە پێی دەوترێت (قصر سلامە)نزیك بوو لە بوصراوە بۆ ئەوەی سوپاکەی لەوێ کۆببێتەوە ،بەڵام ئەوەی کە صەلاحەدینی دواخست لەوەی کەنەدات بەسەر کرك دا ،چونکە ئەو ساڵە کاتی گەڕانەوەی حاجی یەکان بوو (ئەرناط )یش کەسێکی مەسیحی بوو بەڵێنی دا ئەگەر بێتوو صەلاحە دین بدات لە من ئەوا منیش دەچم لەسەر ڕێگای شام و میسر کە دەگەڕێنەوە بۆ شام و میسر لەهەردوو لایان دەدەم و دەیان کوژم ،صەلاحەدینی ئەیوبیش حەجاجەکانی زۆر خۆش ئەویست وەڕێگای سینای میسر یشی چککردبوو بۆ ئەوەی خەڵکی بەئاسانی بڕوات بۆ حەج ،ئەوە بوو خێرا ڕۆیشت وهەموو سەربازەکانی خستە پاسەوانی حاجییەکان بۆئەوەی حاجی یەکانیش بەسەلامەت وئاسانی بگەڕێنەوە،دوای ئەوە توانی بەو شێوەیە خەڵکەکە بپارێزێ و حەجاجە موسڵمانەکان بە ئامان ومتمانەییەوە بیان پارێزێ، وەك دەزانین دوعای حاجیان قەبوڵە،چونکە وەك مەلۆتکەکراوەی لە عەرەفەو گەڕاونەتەوە وە لە حەج وخزمەتی خوای گەورە گەڕاونەتەوە بۆ ماڵ مەنزڵگای خۆیان هەموو ئەم حاجییانە کە بەسەداها هەزار کەس دەبوون دوعای خێریان بۆ صەلاحەدینی ئەیوبی و سوپاکەی صەلاحەدین دەکرد ئەمە بۆ خۆی گەورەترین دەسکەوت بوو بۆ صەلاحەدین ئەیوبی کەبەدەستی هێنا بوو.

دواتر (مجلسی شورای) بەست بۆ ئەوەی کاتێك دیاری بکەن کەهەموویان پێکەوە بچنە دەرەوە لە ١٧ی رەبیعی کۆتایی ساڵی ٥٨٣کۆچی= ساڵی ١١٨٧ز لەدوای نوێژی هەینی لەهەموو مزگەوتەکانی شارەکان وئەمارەتەکانی ژێر دەستی صەلاحەدینی ئەیوبی دا تەکبیری موسڵمانان دەستی پێکرد وە بانگەشەی جیهاد دەستی پێ کرد بە (حی علی جیهاد) ودەنگی الله اکبر وە زرەی شمشێر موسڵمانەکان بە جوانترین شێوە خۆیان ئامادە کرد بۆ ئەوەی بچنە دەرەوە بۆ ڕووبەڕوو بونەوەی ئەرناط وە صەلاحەدینی ئەیوبی خۆشی چووە دەرەوە لە دیمەشق بەرەو جێگایەك کەپێی دەوترێت (قصرسلامە)کە بڕیاریان دابوو لەوێدا هەموویان کۆببنەوە ،لەوکاتەدا برایەکی وکوڕێکی بەناوی (ملیك افضل) وەهەروەها ئەو کەسەشی کە لەبنەڕەتدا تورکامانە (مەلیك مظفر کە وکبوری) کەبە مەلیك مظفر ناسراوە دواتر ئەوەی خیانەت لە صەلاحەدینی ئەیوبی دەکات دەچێتە لای دەوڵەتی ئەتابەگییەکان لای (شێخ عبد الرحمن)و لەدوای دا دەبێتە والی هەولێر،بەڵام مظفرالدینی تورکمانی ڕووەو عەککا سوپا دەنێرێ وە هەروەها مەلیك افضل کوڕی سوپایەکی پێ دەنێرێ بۆ جێگایەك کەپێ ی دەوترێت (رأس الماو) هەموو ئەمانە کۆدەبنەوە تاوەکو لە عەککا وە دێن وە ئەوی تریش لە (رأس الماو)وە دێت بۆ ئەوەی سەر لە سوپای صەلیبی بشێوێننوە صەلاحەدین خۆیشی لە بوصرا وە دەکەوێتەڕێ تاوەکو دەگاتە قەلاَکانی کرك وەلەوێ وە بۆ ئەوەی مانۆڕایەکی سەربازی بکات وە سوپای صەلیبی پەلکێشی ناوچەیەك بکات لەڕووی سەربازی یەوە سەرکەوتنی ئەویوبی یەکان مسۆگەربکات بۆ ئەمەش ناوچەی تەبەرییە هەڵ دەبژێرێت سوپاکەی هەموو کۆدەکاتەوە لەو جێگایەدا دەشی زانی نیازی ئەوەی هەیە کەڕووبەڕووی ئەرناط دەبێتەوە ،

وەکاتێ ئەرناط دەبینێ بەم شێوەیە صەلاحەدین سوپای بۆ کۆکردووەتەوە ئەرناط لەتاواندا داوا لە بیت المقدیس و عەککا وصور وصیدا بەئەمارەتەکانی تری رەهاو ناوچەکانی تر هەمووی سوپای صەلیبی کۆدەکاتەوە دژی صەلاحەدینی ئەیوبی ئەوانیش لە هەمووولایەکەوە کۆدەبنەوە ،وەموسڵمانەکانیش دەزانن کە ئیتر کاتی جیهادە بۆ ئازاد کردنی بیت المقدیس ،وەماوەیەکە چاوەکان فرمێسکی پێدا نەهاتووەتەوە خوارەوە بۆ جیهاد وە ماوەیەکە دڵەکان ئازایەتی و عیزەت نەیگرتووە ،هەروەها دەستیان شمشێری نەگرتووە بەرامبەر بەئەهلی کوفر بۆئەوەی سەر لەنوێ عیزەت وسەربەرزی موسڵمانان بگەڕێتەوە ،ماوەیەکە موسڵمانان خەوتوون کە شەڕی ناوخۆ گیرۆدەی کردوون سەرلەنوێ ئێستا وا صەلاحەدین خەو لە چاوی تۆراوە ،قازی لەدوای قازی یە بەڕێزەکان وزاناکان بەتایبەتی (بهاو الدینی ابنوشداد)کە یەکێکە لە قازی یە گەورەکانی دەوڵەتی ئەیوبی هەموو ئەمانە پێکەوە هانی خەڵکی دەدەن بۆ ئەوەی بچنە جیهادو بەرەو جیهاد هەنگاو بنێن.

# قەرەقوش

## ئەرناط بە دیل دەگرێت ؟

مليك عادلی برای صەلاَحەدين لەگەڵ ئەژدەری توركمان دا (قەرەقوش) واتای (هەڵۆی رەش)دێت بەلاَم بەداخەوە خەڵكی بە خراپە باسی لێوە دەكەن ،قەرەقوش یەكێك بوو لەو سەركردە بەڕێز وبەتوانایانەی توركمان بوو لەگەڵ صەلاَحەدینی ئەیوبی دا وەمەیمەنەی صەلاَحەدین بوو،وەكەسێكی دادپەروەر و دیندار بوو بە هۆكاریقەرەقوش بوو كەتوانی ئەرناط یش بەدیل بگرێت وبیخاتە ژێر دەسەلاَتی صەلاَحە دینەوە،هەروەها كەسێك بوو ئەستێرەی ئەدرەوشایەوە لە جەنگەكاندا لەهەر لایەكەوە دەیان بینی كەوا قەرەقوش دەجەنگا لە پێناوی خوای گەورە،هەروەها قەرەقوش هاواری جیهاد دەكاتەوە وەزۆر جار ئەسپەكەی بریندار بووە و مردار بوەتەوە و ئەسپی تریان بۆ هێناوە ،تەنانەت لە كۆتایشدا درعیش فڕێ دەدات و بەرامبەر بە صەلیبی یەكان شەڕ دەكات كە بۆخۆی درع فڕێ درا لەشەڕ دا لەو سەردەمەدا واتا هێزو توانا ،بۆیە قەرەقوش بەهێز وتوانا شەڕ دەكات وەبەرپرسی قەلاَی كرك (ئەرناط )دەگرێت بەدیل ،هەروەها پێویستە ئەم چەمكە مێژوویان ڕاست بكرێتەوە كەوا قەرەقوش بۆخۆی كەسێكی دادپەروەر بووە ،وە قسەی شێواندنی مێژوو نوسەكانە كەباس لە قەرەقوش دەكرێتەوە بەیەكێك دەڵێن ئەگەر حوكمەكەی خراپ بێت دەڵێن ئەمە حوكمی قەرەقوشە ،ئەمەش كەسێكی گەندەڵ و خراپەكار بەناوی (ئیبنومەماتی) لەدژی قەرەقوش ئەم شتانەی بلاَوكردۆتەوە ،هەروەها (كافور) كەكەسێكی بەڕێز بووە لەناو دەوڵەتی ئەخشەدییەكاندا ،بەلاَم كەسانێكی وەكو (موتەنەبی) شعری لەسەر نوسی وەو قسەی خراپ یان پێ كردووە ،بۆیە قەرەقوش و كافوریش چەواشەی دەستی دوو شاعیری گەندەڵن ئەوانیش( موتەنەبی وابنو مەماتی)ین ،موتەنەبی هەر داوای پێغێمبەرایەتی دەكرد بۆ خۆی پێ ی وابوو كە خۆی پێغەمبەرە ،تاوەكو لەمیسر كردیانە دەرەوە و ڕۆیشتە ناوچەكانی بغداد دوای ئەوە ئەو قسەی یەی كپ كردەوە بۆ ئەوەی نەكوژرێ.

صەلاَحەدینی ئەیوبی دوو پادشاكی كەوتە دەست ئەوانیش(جای لزجنیان )پادشای بیت المقدیس و (ئەرناط ) ی بەرپرسی قەلاَی كرك بوون ،هەردوو كیان لەبەردەستی دا بوون ،صەلاَحەدین سوجدەی سوپاسگوزاری برد وەبەدوای دا كوڕەكانی و براكانی وە هەموو سەركردەكان بەرزی ئیسلام سوجدە سوپاسگوزارییان برد بۆ خوای گەورە كە هەموو سەركەوتنێك یان پەیوەندی هەیە بەخوای گەورە وە كەسەركەوتنەكان یان دەگەڕاندەوە بۆ خوای گەورە وە پێ یان وابوو ئەم سەركەوتنە خوای گەورە پێ یانی بەخشی وە ئەمان بەنیازی ئەوە نەبوون ،هەروەها كۆكردنەوەی خەڵكیش پێ یان وابوو ئەم توانایە خوای گەورە پێیانی بەخشی وە ،بۆیە كاتێك كە سەریان بەرز كردەوە پادشاكانی صەلیبی بەلوت بەرزی یەكەوەو داوای ئاویان دەكرد ،صەلاَحەدینی ئەیوبی ئاوێكی ساردی هێنا بۆیان وە پێ شیانی وت ئەمە واتای ئەوەنی‌یە كە ئێوە ئەمان تان دراوەتێ نەخێر ئەمان تان نادرێتێ ،بەڵكو سوێندی خوارد بوو كەوا بەدەستی خۆی بیكوژێت ،چونكە قسەی بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وتبوو ،ئەوە بوو صەلاَحە دین بەدەستی خۆی دەیكوژێت و سەری دەبڕێ لە پێش چاوی هەموو یاندا وە پێشیان دەڵێت ئەمە هەقی ئەو كەسەیە كە قسە بە خوا و پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەڵێت ،بەمەش ئەوەندەی تر ترس و بیم ودڵەڕاوكێ چووە ناو دڵی صەلیبی یەكانەوە ،وە سەربەرزی و عیزەتیش چوویە ناو دڵی موسڵمانەكانەوە.سەركردەی موسڵمان بەو شێوەیە دەبێت ،هەركەسێك بە پاك و بێگەردی ئیسلام هەڵ نەگرێ وەك صەلاَحەدینی ئەیوبی پاك وبێ خەوشی نەكات لە فكری شیعەو صەلیبی هەموو ئەفكارەكانی تر موستەحیلە سەركەوتنی ئەو ئوممەتە (إن تنصروا الله ینصركم ویثبت أقدامكم)



## دامەزراندنی دەوڵەتی ئەیوبی

کاروباری ناو ووڵاتی میسر سەقامگیر بوو بۆ (صلاح الدین)، خێزانەکەی و باوکی (نجم الدین ئەیوب)ی هێنایە لای خۆی تاکو چیتر خەمی لایان نەمێنێت و بەخۆشی و بەختەوەری پێکەوە بژین بەهەمان شێوەی چیرۆکی پێغەمبەر یوسف (علیه السلام) کە بوویە فەرمانڕەواو عەزیزی ناوچەکە باوك و براکانی هانیە لای خۆی، (صلاح الدین) بە وەزیر مایەوەو هەموو کاروبار لەژێر دەستی بوو تاکو کۆتا خەلیفەی فاتمییە شیعەکان مرد لەساڵی (٥٦٧ ك - ١١٧١ ز)، بەو شێوەیە دەوڵەتی فاتمیی کۆتایی پێ هات و دەوڵەتی نەوەی ئەیووب (دەوڵەتی ئەیوبی) دەستی پێ کرد.

)صلاح الدین)یش ناونرا بە (الملك الناصر - میرنشینی سەرخەر)، وە گەڕایەوە بۆ ئەو ماڵەی (اسد الدین شیرکۆ)ی مامی تیایدا دەژیا و پێی دەسەلاتەکەی جێگیر کرد لە ناوچەکە.

پاشان داوای کرد لە (پادشا نورالدین زەنگی) کە براکانی بنێرێتە لای خۆی، بەڵام نورالدین ڕازی نەبوو وە پێی ووت کە دەترسم یەکێك لە براکانت لە قسەت دەربچن و ئیتر کارو باری ووڵات تێك بچێت.

پاش ئەوە جارێکی تر خاچ پەرستان هێزیان کۆ کردەوەو ویستیان سەرلەنوێ هێرشێکی تر بەرنە سەر ناوچەکانی میسر، بۆیە نورالدین زەنگیش عەسکەری کۆ کردەوەو لەگەڵیاندا براکانی (صلاح الدین)ی نارد لەناویاندا (شمس الدولة) تۆران شاه، کە لە (صلاح الدین)یش گەورەترە.

لێرەدا (ابن اثیر) باسی ئەو ناخۆشیەی نێوان نورالدین زەنگی پادشای شام و (صلاح الدین ئەیوبی) دەکات :

لەساڵی (٥٦٧ ك - ١١٧١ ز) شتێکی وا ڕووی دا نورالدین بەرامبەر (صلاح الدین) سارد و نارازی بوو، ڕووداوەکەش لەوەوە دەستی پێ کرد کە نورالدین نامەی نارد بۆ (صلاح الدین) و فەرمانی پێ کرد کە هەرچی عەسکەر و هێزی ناوچەی میسر هەیە کۆ بکاتەوەو بیانهێنێتبۆ سەر ئەو ناوچانەی خاچ پەرستەکانی تیادایەو کردوویانەتە مۆڵگە وشاری خۆیانپێش هەموو شتێك بە هێزەکەیەوە گەمارۆی شارۆچکەی کەرەك (الكرك) بدات و تا ئەمیش بە خۆی و هەرچی هێزی هەیە دەگاتە ئەوێ و پێکەوە دەجەنگێن لەگەڵ خاچ پەرستان و ناوچەکانیان دەست بەسەرا دەگرن وبەهەتایی شوێنەواریان ناهێڵن لەوێ..



## سەرەتایی کارەکانی

سەرەتا (صلاح الدین) لە (٢٠ی موحەڕەم) ڕەزامەندی خۆی نواند و بە نورالدینی ڕاگەیاند کە دەرچوونەکە دوا ناکەوێت، لێرەدا نورالدین کەوتە کۆکردنەوەی عەسکەرەکانی و هەموو هێزەکانی ئامادە کرد و چاوەڕێی هەواڵ بوو لە (صلاح الدین)ەوە کە کەوتبێتە ڕێ و تاکو ئەمیش بکەوێتە ڕێ، کاتێك هەواڵی پێ گەشت کەوتە ڕێ لە دیمەشقەوە بەرەو (کەرەك) و گەیشتە ئەوێ و چاوەڕێی گەیشتنی (صلاح الدین)ی دەکرد، بەڵام لە ڕێگادا (صلاح الدین) نامەی نارد بۆ نورالدین و داوای لێبوردنی لێ کرد کە ناتوانێت بگاتە لای و هەواڵی خێرای پێ گەیشتووە بەوەی کاروباری ناو ووڵاتی میسر نائارام بووەتەوەو هەندێ لە شیعە عەلەوییەکان دەیانەوێت دەسەڵات بگرنەوە ئەستۆ چونکە هیچ هێز و چەکداری تیادا نەماوەو هەموو کەوتوونەتە ڕێ، بۆیە ناتوانێت دوور بێت لە میسر لەترسی ئەم کارەو وا دەگەڕێتەوە بۆ میسر، بەڵام نورالدین عوزرەکەی لێ قبوڵ نەکرد، وە هۆی ئەوەی کە (صلاح الدین) نەیویست خۆی بگەیەنێتە ئەو شوێنە، هەندێ لە پیاو و کەسە نزیکەکانی ترساندیان لە گەیشتن وچاپێکەوتنی بە نورالدین، بۆیە کاتێك فەرمانەکەی نورالدینی بەجێ نەگەیاند، نورالدین بەلایەوە گەورە بوو وە پێی نارەحەت و دڵگران بوو، وە گومانی برد کە (صلاح الدین) یاخی بووە لێی و بڕیاری دا بەهێزەوە بگاتە میسر و دەسەڵات بگێڕێنێتەوە بۆ خۆی و (صلاح الدین) دەربکات.

ئەم هەواڵە گەیشتە (صلاح الدین)، هەموو کەسوکاری لەوانە باوکی (نجم الدین) و خاڵۆی (شهاب الدین الحارمي) و لەگەڵ هەموو سەرکردەکانی سوپاکەی، پێی ڕاگەیاندن بە نیازی نورالدین بۆ وەرگرتنەوەی میسر لێی و مەشورەتی لەگەڵ کردن، بەڵام هیچ کەسێکیان شتێکیان نەووت کە چی بکات، لێرەدا توقیەددین (تقي الدین)ی کوڕەزای هەستا و ووتی: گەر نورالدین بێت بۆ ئێرە دەجەنگێین لەدژی و بەرەنگاری دەبینەوە، هەندێ لە کەسوکاری هەمان ڕایان بۆ دروست بوو، بەڵام (نجم الدین)ی باوکی هەستایە سەری و لێی تورە بوو وە پەرچی ئەم ڕایەی دایەوە و ووتی شتی وا نابێت، نجم الدینیش پیاوێکی لێهاتوو بەسەلیقەت بوو، بە توقیەددینی ووت دانیشە وتورەبوو لێی بگرە جنێویشی پێ دا، ئینجا ڕووی کردە (صلاح الدین) و پێی ووت: من باوکتم و ئەوە شهاب الدینی خاڵۆتە، ئایە لەو باوەڕەدایت لەم هەموو خەڵکە هەموو تۆیان خۆش بوێت و خێری تۆی بوێت وەکو ئێمە؟ (صلاح الدین)یش فەرمووی نەخێر، پێی ووت: دەی واللە گەر من و خاڵۆت شهاب الدین چاومان بە پادشا نورالدین بکەوێت هیچمان لەدەست نایات مەگەر لەبەردەمی بوەستین و زەویەکە لەبەردەستی ماچ بکەین، وە گەر فەرمانمان پێ بکات بدەین لە گەردنت بە شمشێر ئەوا دەیکەین، بۆیە گەر ئێمە وابین ئەبێت غەیری ئێمە چۆن بێت، لەکاتێکدا هەموو ئەم سەرکردە و عەسکەرانەی دەیبینی گەر نورالدین ببینن هیچیان خۆی ناگرێت لەسەر ئەسپەکەی مەگەر دابەزێت و ماچی زەوی بکات لەبەردەستی و ئەم ووڵاتەش هی ئەوەو ئەو تۆی داناوە تیایدا و گەر بیەوێت تۆ لابەرێت لەسەر دەسەڵات پێویستی بە هاتنی خۆی ناکات بەڵکو بە ناردنی کیتابێك فەرمانت پێ دەکات بڕۆیتە خزمەتی و ووڵاتەکە بداتە دەست کەسێکی تر، لەکۆتاییدا بە هەموو ئامادەبووانی ووت: هەستن لامان و بڕۆنەوە و ئێمە مەمالیکی (نورالدین)ین و خزمەتکار و عەبدی ئەوین چی بوێت لێمان ئارەزووی خۆیەتی بیکات. لەسەر ئەم کارە هەموو بڵاوەیان پێ کرد و چەندەها کەسی ئامادەبووی دانیشتنەکە ئەم هەواڵەیان لە ژێرەوە بۆ نورالدین نوسی.

پاشان نجم الدین بەتەنها بوویەوە لەگەڵ (صلاح الدین) وپێی ووت: تۆ نەزانی و شارەزاییت کەمە، چۆن ئەم هەوو خەڵکە کۆ دەکەیتەوەو ئەوەی لە دڵتایە پێیان ڕادەگەیەنیت، چونکە گەر نورالدین بزانێت تۆ ڕێی لێ دەگریت لە ووڵاتەکە و گوێڕایەڵی نیت ئەوا دەتخاتە پێش هەموو کارێکەوەو بەلایەوە گرنگ دەبێت لات بەرێت خۆ نیازی لابردنتی هەبێت و بگاتە ئێرە کەس نابینیتەوە لەم هەموو عەسکەرە لەگەڵتا بمێنێت، بەڵکو تەسلیمی ئەوت دەکەن، بەڵام پاش ئەم دانیشتنە پیاوانیخۆی هەواڵ و قسەکەی منی پێ دەگەیەنن، تۆش نامەی بۆ بنوسە و پێی ڕابگەیەنە کە هەر پێویستیەکت هەبێت بە لادانی من لەسەر دەسەڵات، ئەوا(جەناب)ێك بنێرە (جەناب ئەو پیاوەیە فەرمانی پادشا و دەسەڵاتدار دەگەیاندە شوێنەکانی ژێر دەسەڵاتەکەی واتە وەکو مەئمور)، واتە مەئمورێك بنێرەیەتێك بخاتە ملمەوەو بمهێنێتە لات، چونکە گەر ئەمە ببیستێت وازت لێ دەهێنێت ولات نابات بەڵکو دەڕوات بەلای ئەو کارانەی ترەوەی گرنگتر بێت، بەلایەوە، پاشان ڕۆژگار درێژەو خوای گەورە کاروبار دەبات بەڕێوە، ئەگینا واللە گەر نورالدین یەك قامیشێکی شەکەری ئێمەی بەزۆر بوێت من خۆم شەڕی لەگەڵ دەکەم تاکو ڕێی لێ دەگرم یان دەکوژرێم، ئەوەبوو (صلاح الدین)یش بەقسەی باوکی کرد. وە کاتێنورالدین بیستی کە (صلاح الدین) لە فەرمانی ئەم دەرناچێت وازی لێ هێنا هەرەك نجم الدین لەو باوەڕەدا بوو، ئەمەش باشترین بۆچون و چاکترینیان بوو

## هێرشی خاچ پەرستان بۆسەر میسر

پاش ئەوەی خاچ پەرستەکان زانیان کاروباری میسر کەوتۆتە دەست (صلاح الدین) و دەرکی ئەوەشیان کرد کە چیتر دەسەڵاتی ئەمانیش لەناوچەکەدا کەوتۆتە ژێر مەترسی و بێگومان قەڵا و شوێنەواریشیان لە ڕەگەوە هەڵدەکێشێت بەو هەموو دەسەڵات و موڵکەی وەدەستی هێناوە، خاچ پەرستەکان لەگەڵ ڕۆمەکان یەکیان گرت و بەنیازی ناوچەکانی میسر کەوتنە ڕێ، یەکەم جار ڕوویان کردە شاری (دمیاط) لە باکوری میسر و هەموو چەك و کەلوپەلی گەمارۆدانیان لەگەڵ خۆ هانی، کاتێك نورالدین زەنگی ئاگاداری شاڵاوی خاچ پەرستان و ڕووکردنیان بەرەو شاری (دمیاط)ی زانی یەکسەر هێز وعەسکەری ناردە شارۆچکەی کەرەك (الكرك) کە یەکێك بوو لە بنکەکانی خاچ پەرستان بەنیازی ڕێگرتن لە شەپۆلیان وچیتر نەگەنە (دمیاط) بەئاسانی، بەڵام خاچ پەرستەکان ڕێچکەکانیان گۆڕی

# ژیانی سەڵاحەدینی ئەیوبی

و لەڕووی قەراغی دەریاکانەوە ڕوویان کردە (دمیاط) و پاشان هێزەکانی نورالدین (کرك)یان بەجێ هێشت و ویستیان بگەنە خاچ پەرستان و بجەنگێن لەگەڵیان تا ڕێیان لێ بگرن، بەڵام فریایان نەکەوتن.

لەلای (صلاح الدین)ینەوەش کاتێك ئاگاداری مەبەستی خاچ پەرستان بوو بۆ داگیرکردنی (دمیاط)، خۆی ئامادە کرد بۆیان بە هەرچیەك لە توانایدایە بە چەك و پیاو و کەرەستە، یەکەم هەنگاو یارمەتی ناردە ناو شارەکەوەو پەیمانی پێ دان کە فریایان دەکەوێت و هێز و چەکی زیاتریان بۆ بنێرێت گەر خاچ پەرستەکان بگەنە شارەکە .
کاتێك خاچ پەرستان گەیشتنە سەر شارەکەو هێزی موسڵمانان لە ناوەوەی شارەکە کەوتنە بەرەنگاربوونەوەیان و (صلاح الدین)یش لە دەرەوەی شارەکەوە هێرشی بۆ هێنان، ئەنجامی شەڕەکەش بە ویست و ڕەحمەتی خوا بە سەرکەوتنی عەسکەری موسڵمانان کۆتایی پێ هات، فەزڵی گەورەش پاش خوای گەورە دەگەڕێتەوە بۆ (صلاح الدین) کە وەکو وەزیرێك زۆر بە دانایی پلان و نەخشەی شەڕەکەی گێڕا، بۆیە هەرچی هێزی خاچ پەرستان هەیە تێك شکا و هەموو مەنجەنیقەکانیان سوتێنرا و ژمارەیەکی زۆر لە چەکدارەکانیان کوژرا و هەموو چەك و کەرەستەکانیان مایەوە بۆ موسڵمانان و خەڵکی شارەکە .



## صلاح الدين لە ميسر

صلاح الدين لە ميسر و نەمانی دەسەڵاتی (فاطمي)یەکان
لە میسردا حوکمی (فاطمی) شیعەیی دەڕۆشت بەڕێوە، وەزیر دەسەڵاتی تەواوی هەبوو، لەولاشەوە خەلیفەیەکی فاتمی دانرابوو تەنها بەناو دەسەڵاتی هەبوو کە دواهەمینیان ناوی (العاضد) یان (العاضد بامر الله) بوو، (شاور مجیر السعدی) بووە وەزیر و فەرمان ڕەوایی گرتە دەست بەڵام ئەوەندەی نەبرد (ضرغام بن عامر بن سوار) دەسەڵاتی لێ زەوت کرد و دەستی گرت بەسەر دەوڵەتدا و کوڕەکەشی بەناو (طي بن شاور)ی کوشت، ناچار (شاور) ڕای کرد لەدەستی و میسری بەجێ هێشت و ڕووی کردە شام و هاواری بردە لای پادشای دادوەر نورالدین زەنگی لە مانگی ڕەمەزان ساڵی (١١٦٣ز - ٥٥٨ ك)، لەولاشەوە (ضرغام) هانای بردە لای (عموری)ی گاور پادشای بيت المقدس، مەلیك نورالدین سوپایەکی ئامادە کرد بەرەو میسر بە سەرکردایەتی اسدالدین (شێرکۆ کوڕی شازی) بۆ گێڕانەوەی شاور بۆ دەسەڵاتەکەی، وە یەکێك لەو کەسانەی لەناو عەسکەرەکە بوون صلاح الدين بوو لەتەمەنی نزیکەی (٢٦) ساڵیدا بوو، هەرچەندە صلاح الدين وەکو یاریدەدەرێکی مامی ڕۆشتبوو بێ ئەوەی حەز بکات بەو ڕۆشتنەی، مەلیك نورالدین لە ناردنی ئەم سوپایەش دوو ئامانجی هەبوو:
یەکێکیان: گێڕانەوەی حەقی (شاور) بوو چونکە هاواری بۆ هێنابوو وە داوای یارمەتی لێ کردبوو.
دووهەمیان: دەیویست هەواڵ و باری میسر بزانێت، چونکە هەواڵی پێ دەگەشت کە میسر زۆر لاوازە لە ڕووی سەربازییەوەو حاڵ وباری زۆر نا ڕێکە، بۆیە ویستی ڕاستێتی ئەم شتانە لەنزیکەوە بزانێت.
پادشا نورالدين زەنگی زۆر پشتی بە (اسد الدين شێرکۆ) دەبەست چونکە پیاوێکی زۆر ئازا و بلیمەت بوو، جگە لەوەش خاوەن زانست و ئەمانەت پارێز بوو، بۆیە ئەو کارەی پێ ڕاسپارد و (اسد الدين)یش کوڕەزاکەی واتە (صلاح الدين)ی خستە پێشەوەی سوپاکەی و (شاور)یش لەگەڵیاندابوو، هەموو دیمەشقیان بەجێ هێشت بەرەو میسر لەساڵی (١١٦٣ ز - ٥٥٩ ك) و لە ئەنجامی چەند شەڕێکدا بە شکست هێنانی (ضرغام) و کوژرانی دەسەڵاتیان گرتەوە لە میسر لە مانگی ڕەجەبی هەمان ساڵ.

# ژیانی سەڵاحەدینی ئەیوبی

کاتێکیش شاور گەشتە ئامانج و ئاواتەکەی و گەڕایەوە سەر تەختی دەسەڵات و هێز و دەسەڵاتی خۆی جارێکی تر بەرپا کردەوە، خیانەتی لە اسد الدین شێرکۆ کرد کە خۆی و سوپاکەی بۆ یارمەتی ئەم مابوونەوە.. ئەوەبوو شاور ئەم جارە هاواری بردە لای خاچ پەرستەکان و داوای کۆمەکی لێیان کرد لەدژی اسد الدین، ئەوانیش بە سوپایەکی گەورەترەوە هاتن بەرەو میسر و سوپاکەی (اسد الدین)یان گەمارۆدا لە ناوچەی (بەلبیس)و ناچار گەڕایەوە بۆ شام، پاش گەڕانەوەی خۆی میسری بینیبوو وە هەموو ناوچە و بارێکی ئاشنا بوبوو وە ئەوەشی دەزانی کە میسر دەوڵەتێکە بەبێ پیاوەو و هەموو کاروبارەکان تەنها بە فێڵ و هەڕەمەکی دەڕوا بەڕێوە، بۆیە چاوی تێ بڕیبوو. پاش مانەوەی لە شام بە ماوەیەك بیری دەکردەوە لە گەڕانەوەی بەرەو میسر و خۆی بکاتە پادشای ئەو ناوچەیە و لەهەمان کاتدا دەسەڵاتەکەی کە درێژەی دەسەڵاتی پادشا نورالدین زەنگی‌یە فراوانتر بکات، ئەمەش لە ساڵی ( ١١٦٦ز - ٥٦٢ ك) بوو . لەلایەکی ترەوەش خۆی و پادشا نورالدین ئاگاداری ئەو خیانەتەی شاور بوون کە هێزی خاچ پەرستانی هێنایە ناو میسر لەدژی ئەمان، بۆیە ترسی ئەوەیان لێ نیشت کە خاچ پەرستان دەست بگرن بەسەر میسردا و پاشان هەموو ناوچەکانی تریش بهێننە ژێر دەسەڵاتی خۆیان و ببنە مەترسیەك بۆ ئەمانیش .

اسد الدین جارێکی تر سوپایەکی ئامادەکرد و پادشا نورالدین زەنگی هەموو سوپاکانی تری خۆیشی خستە بەردەستی لەگەڵ (صلاح الدین)یش، لەهەمان کاتدا کە اسدالدین و سوپاکەی بەرەو میسر ڕۆشتن هێزی خاچ پەرستانیش کەوتنە ڕێ بەرەو میسر، لێرەدا فاتمییەکان (شاور و میسریەکان) لەگەڵ خاچ پەرستاندا هەموو ڕێککەوتن لەسەر (اسدالدین) و چەندەها شەڕ و پێکدادان ڕووی دا .. پاش ئەوە (صلاح الدین) بەڕێکەوت بەرەو شاری ئەسکەندەریەو لەوێدا گەمارۆ درا لەلایەن شاور و فاتمییەکانەوە لەساڵی (نیسان/ ١١٦٦ - جماد الاخره/ ٥٦٢ك)، پاشان اسد الدین گەڕایەوە لەڕووی (صعید)ەوە بەرەو شاری (بلبیس) و لەوێدا سازش کرا لەگەڵ شاور و خەڵکەکەی و ئەو کاتە ڕێیان دا بە (صلاح الدین) بگات پێی و ئەویش گەڕایەوە بەرەو شام .

پاش ئەوە اسدالدین بۆ جاری سێهەم گەڕایەوە بەرەو میسر، ئەم جارەش هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی خاچ پەرستەکان هەرچی هێزیان هەبوو بە سوارچاك و پیادەوە ڕوویان کردبووە میسر بۆ داگیرکردنی یەکجارەیی و بەبێ گوێدان بەو عەهد و پەیمانەی هەیانبوو لەگەڵ میسریەکان و اسدالدین کە پێشتر ڕێککەوتبوون بەهیچ شێوەیەك هێزەکانیان ڕوو نەکاتە ناوچەکانی میسر.. ئەم هەواڵەش کاتێ گەیشتە اسدالدین و نورالدین بەهیچ شێوەیەك ئارامیان نەما و بەپەلە ویستیان خۆیان بگەیەننە میسر و ڕێ بگرن لە شاڵاوی هێرشەکانی خاچ پەرستان، پادشا نورالدین زەنگی بەهەموو پارەو سامان و پیاوەکانی هێزی کۆ کردەوە بەڵام خۆی نەیتوانی بڕوات بۆ میسر نەوەك ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئەمیش لە شام بکەوێتە بەر هێرش، وە اسدالدین بە خۆی و ماڵی و هەموو براو کەسوکاری و پیاوەکانی بەشدارییان کرد لەم ڕۆشتنە بەرەو میسر.. بن شداد دەڵێت: سوڵتان (صلاح الدین) پێی ووتم من لەهەموو کەس زیاتر لەو جارەدا پێم ناخۆش بوو بە دەرچوونم بەرەو میسر، وە لەگەڵ مامم بەئارەزووی خۆم دەرنەچووم، ئەمەش مانای فەرموودەکەی خوایە کە دەڵێت: (وعسى أن تكرهوا شيئا وهو خير لكم) (البقرة:٢١٦).

کاتێك شاور زانی کە هەموو خاچ پەرستان کەوتوونەتە ڕێ بەرەو داگیرکردنی یەکجارەیی میسر و لەناوبردنی دەسەڵاتەکەی ناچار جارێکی تر هاوار و هانای هێنایەوە بەر اسد الدین و ئەمیش بە پەلە بە سوپاکەیەوە گەیشتنە ناو میسر لەساڵی ( ١١٦٨ز - ٥٦٤ك)، بۆیە کاتێك خاچ پەرستەکان بە گەیشتنی (اسدالدین)یان زانی بۆ میسر کە بە ڕێککەوتن بووە لەگەڵ میسرییەکان ئیتر هیچیان بۆ نەمایەوە بەسەرشۆڕی گەڕانەوە.

# ژیانی سەڵاحەدینی ئەیوبی

پاش ئەوە اسدالدین مایەوە لە میسر خۆی و سوپاکەی بۆ بەرگریکردن لە ناوچەکە و لەو کاتەشدا میسر لەژێر حوکمی فاتمی شیعیی بوو، شاور وەزیر و دەسەڵاتداری فاتمی ماوەی جارێك دەهاتە لای و بەڵێنیشی پێ دابوو کە هەرچەند پارەو سامانیان خەرج کردووە بۆیان بگێرێتەوە بەڵام شاور ئەم بەڵێنەشی نەبردە سەر. وە اسد الدین بەوەشی زانی کە شاور هەرجارەو یاری بە ئەم و بە خاچ پەرستەکان دەکات، وە بۆی یەکلا بوویەوە کە ئارامی و دەسەڵات بەسەر وڵاتدا سەقامگیر نابێت هەتا شاوور لەسەر حوکم بێت، سەرەڕای ئەوەش شاور دەسەڵاتدارێکی زۆر دڵڕەق و ستەمکار بوو تەنانەت خەلیفەی فاتمییەکانیش (العاضد) شکاتی لای اسدالدین کردبوو لەدەستی، بۆیە اسدالدین بڕیاری دا بە کوشتنی شاور، ئەوەبوو کوشتی و خۆی بوویە وەزیری میسر لە بەرواری (١١٦٨/١٢/١٩ز - ١٧ی/ ربیع الاول/ ٥٦٤ ك) وە لەقەبی (الملك المنصور أمیر الجیوش)ی لێ ناونرا، لەو کاتەوە بووە فەرمانڕەوای وڵات و هەموو دەسەڵاتێك دەگەڕایەوە بۆی و (العاضد) بە خەلیفەی فاتمیی مایەوەو (صلاح الدین)یش هەموو کارێکی بەڕێوە دەبرد کە پێی ڕابسپێردرایا بەهۆی بەتوانا و لێهاتویی و زانستی و ئەو سیاسەتە زیرەکانەی هەیبوو، دەسەڵاتی اسدالدین تاکو (١١٦٩/٣/٢٣ز - ٢٢ی/ جماد الاخرە/١١٧٨ ك) بەردەوام بوو واتە تەنها چەند مانگێك و لەو بەروارەشدا کۆچی دوایی کرد.

مێژووناسان دەڵێن کاتێك اسدالدین (شێرکۆ) کۆچی دوایی کرد وەزارەت و دەسەڵات هاتە ژێردەستی سوڵتان صلاح الدین (یوسف بن أیوب) کە ناونرا بە (الملك المظفر صلاح الدین)، ئەمیش دەستی کرد بە جێگیرکردن و بەهێزکردنی دەسەڵاتی خۆی لە وڵاتدا ئەوەبوو دڵی هەموو خەڵکی ڕاکێشا بەلای خۆیدا بەو سیاسەت و کارامەییەی هەیبوو، بووە جێی بڕوای هەمووان بە دادپەروەرێتی و دڵپاکێتی، یارمەتی هەموو هەژارانی دەدا و سوپاسی خوای زۆر دەکرد لەسەر ئەو نیعمەت و بەهرانەی خوا پێی داوەو خۆی دوورەپەرێز گرت لە خۆشی وڕابواردنی دونیا و لەجیاتی ئەوە خۆی ئامادە کرد بۆ دوو بەرە، بەرەی دەرەوە لە بەرەنگاربوونەوەی خاچ پەرستان و ڕزگارکردنی ناوچە داگیرکراوەکانی موسڵمانان و بەرەی ناوەوە لە نەهێشتنی ئەو بیر و دەسەڵاتەی فاتمییە شیعەکان هەیانە لەناو میسردا و بڵاوکردنەوەی مەزهەبی سوننی.



# ژیانی سەڵاحەدینی ئەیوبی

پێدراوێکی زێریی ناوی دواهەمین خەلیفەی فاتمی (العاضد)ی لەسەرە ئەوەبوو لە بەرەی ناوەوە دەستی پێ کرد و گەورە پیاوانی خەلیفەی فاتمی دوورخستەوە لە قاهیرە ودەسەڵاتی لێ لاواز کردن و لەجێی ئەواندا کەسانی خۆی دانا و شوێنە گرنگەکانی هەر بە پیاوانی خۆی ڕاسپارد و تا ڕاددەیەك خەلیفەی فاتمی دوورخستەوە لە خەڵکی و لە ووتاری هەینیشدا لە دوعاکردن پاش ناوی خەلیفەی فاتمی ناوی نورالدین محمود زەنگی پادشای شام دەهات. تاکو جارێکیش لەلایەن فاتمییەکانەوە پیلانێکیان گێڕا بۆ کوشتنی (صلاح الدین) لە کۆتایی ساڵی (١١٦٩ز – ٥٦٤ ك) بەڵام سوپاس بۆ خوا پێی زانی و پیلانگێڕەکەی لەناوبرد، وە گەورەترین هەنگاوی کێشا بۆ لەناوبردنی دەوڵەتی فاتمیی و دامەزراندنی مەزهەبی سوونی لەجێی مەزهەبی شیعە، بۆیە سێ ساڵی خایاند تاکو بەتەواوەتی بگاتە ئەو ئەمانجەی و لەپێناویدا چەندەها قوتابخانەی دامەزراند بۆ خوێندنی مەزهەبی سوننی، قوتابخانەی (الناصرية) بۆ خوێندنی مەزهەبی شافعی یەکەمین قوتابخانەبوو (صلاح الدين) دایمەزراند، پاشان قوتابخانەیەکی تری کردەوە بۆ خوێندنی مەزهەبی مالکی، پاشان کەسوکاری و پیاوانی دەوڵەتەکەشی شوێنی کەوتن لەدروستکردنی قوتابخانە بۆ خوێندنی مەزهەبی سوننی .

پاشان هەستا بە دانانی (صدر الدين عبدالملك بن درباس الشافعي) بە قازی و قازیە شیعەکانی لابرد لەسەر کار، بەو شێوەیە مەزهەبی سوننی دەسەڵات و هێزی گرتەوە دەست و مەزهەبی فاتمیی ئیسماعیلی شیعەیی بەرەو ئاوابوون و لاوازی ڕۆشت و هیچ پشتیوانی نەما لە میسر



پێدراوێکی زێریی ناوی دواهەمین خەلیفەی فاتمی (العاضد)ی لەسەرە ئەوەبوو لە بەرەی ناوەوە دەستی پێ کرد و گەورە پیاوانی خەلیفەی فاتمی دوورخستەوە لە قاهیرە ودەسەڵاتی لێ لاواز کردن و لەجێی ئەواندا کەسانی خۆی دانا و شوێنە گرنگەکانی هەر بە پیاوانی خۆی ڕاسپارد و تا ڕاددەیەك خەلیفەی فاتمی دوورخستەوە لە خەڵکی و لە ووتاری هەینیشدا لە دوعاکردن پاش ناوی خەلیفەی فاتمی ناوی نورالدین محمود زەنگی پادشای شام دەهات. تاکو جارێکیش لەلایەن فاتمییەکانەوە پیلانێکیان گێڕا بۆ کوشتنی (صلاح الدین) لە کۆتایی ساڵی (١١٦٩ز – ٥٦٤ ك) بەڵام سوپاس بۆ خوا پێی زانی و پیلانگێڕەکەی لەناوبرد، وە گەورەترین هەنگاوی کێشا بۆ لەناوبردنی دەوڵەتی فاتمیی و دامەزراندنی مەزهەبی سوونی لەجێی مەزهەبی شیعە، بۆیە سێ ساڵی خایاند تاکو بەتەواوەتی بگاتە ئەو ئەمانجەی و لەپێناویدا چەندەها قوتابخانەی دامەزراند بۆ خوێندنی مەزهەبی سوننی، قوتابخانەی (الناصرية) بۆ خوێندنی مەزهەبی شافعی یەکەمین قوتابخانەبوو (صلاح الدين) دایمەزراند، پاشان قوتابخانەیەکی تری کردەوە بۆ خوێندنی مەزهەبی مالکی، پاشان کەسوکاری و پیاوانی دەوڵەتەکەشی شوێنی کەوتن لەدروستکردنی قوتابخانە بۆ خوێندنی مەزهەبی سوننی .

پاشان هەستا بە دانانی (صدر الدين عبدالملك بن درباس الشافعي) بە قازی و قازیە شیعەکانی لابرد لەسەر کار، بەو شێوەیە مەزهەبی سوننی دەسەڵات و هێزی گرتەوە دەست و مەزهەبی فاتمیی ئیسماعیلی شیعەیی بەرەو ئاوابوون و لاوازی ڕۆشت و هیچ پشتیوانی نەما لە میسر

# ژیانی سەڵاحەدینی ئەیوبی

## ئەنجامەکانی شەڕی حطین

یەکەم : یەکێك لە دەر ئەنجامەکانی ئەم شەڕە کوژرانی گەورە فەرماندەکانی صەلیبی یەکان بوو ،سەربارى لە دەست دانی بەشێکی هەرە گەورەی سوپای هەرسێ میرنشینە صەلیبی یەکان.

دووەم :سەرکەوتنەکانی صەلاَحە دینی ئەیوبی لە شەڕی حطین بوو بەدەرگا کردنەوە لەبەردەمی دا بەوەی کە بتوانێت زۆربەی شارە کەنار ییەکانی (لوبنان وفەلستین) ی ئێستا ڕزگا ربکات.

سێیەم : وە بە دیهێنانی یەکێك لە ئامانجە سەرە کی یەکانی کە خۆی دەبینی یەوە لە ڕزگار کردنی شاری قودس قیبلەی یەکەمی موسڵمانان.

چوارەم : لەدوای ئەم شەڕە بوو بە هۆی ئەوەی پایەی ئاینی و کۆمەلاَیەتی سوڵتان صەلاَحە دینی ئەیوبی لە نێو جیهانی ئیسلام دا بەرز ببێتەوە.

پێنجەم : دوای ئەم شەڕە دەسەلاَتی ئەیوبی یەکان بەتەواوی چەسپا ،هەروەها کاریگەری شەڕی حطین و ئەنجامەکانی لەسەر ئەوروپا گەشتە ڕادەی ئەوەی پاپا گریگۆری هەشتەم بانگەواز بکات بۆ سێ لەگەورە ئیمپراتۆری ئەو سەردەمە (ئەڵمانیا ، فەرەنسا و بەریتانیا) بکات بۆ هێرش کردنە سەر ناوچەکانی ڕۆژهەلاَت کە دەناسرێت لە مێژووی شەڕی صەلیبی یەکان بە شالاَوی سێیەمی خاچی پەرستان.

شەشەم : سەرکەوتنی صەلاَحە دینی ئەیوبی لەم شەڕەدا کاریگەری گەورەی لەسەر هەموو ئەوروپا بەگشتی و مەسیحی یەکان بەتایبەتی دروست کرد ، بووە هۆی ئەوەی میرنشینە خاچی یەکان لە ناوچەکانی ڕۆژهەلاَت دەسەلاَتیان سنوردار بکرێت و وە پەیوەندیشیان بەناوچەکانی ئەوروپاوە پچڕاند،وە سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە هەموو سەرکردە سیاسی و سەربازی یەکانی ئەیوبی پێ یان وابوو کە سوڵتان صەلاَحە دینی ئەیوبی دوای ئەم جەنگە بەرەو ئامانجی سەرەکی دەڕوات کە بریتی یە لەڕزگار کردنی (قودس)،بەلاَم بە پێچەوانەوە سوڵتان صەلاَحە دین بەرەو ناوچە کەنارییەکان کەوتەڕێ کەخۆی دەبینیەوە لەشارەکانی (عکا ، بیروت ،یافا ،حیفا ،غەززە و صور) وتوانی لە پلانەکەی سەرکەوتوو بێت جگە لە گرتنی شاری صور نەبێت ،ئەویش بەهۆی گرتنی ناوچەکەو شورای شار و بوونی ئاو لەدەورووبەری شاری صور.

رزگارکرنی چەند قەلاَو شارێك:
موسڵمانەکان خۆش حاڵ بوون بەو سەرکەوتنەی صەلاَحە دینی ئەیوبی ،صەلاَحە دین ئەو ڕۆژە مایەوە لە سەر بازگەکەی بۆ ڕۆژی دوای کەجەنگ کۆتایی هات ڕۆشت بۆ قەلاَی تەبەرییە هاوسەرەکەی ریمۆند داوای لە صەلاَحە دین کرد کەوا پەیمانی پێ بدات کەوا هیچی لێ نەکات ،ئەویش پەیمانی پێ داو خۆی و کوڕەکانی هاتنە دەرەوە وە ئەوانیش ڕێزیان لێگرتن ،پاشان صەلاَحە دینی ئەیوبی زۆر بە خێرای ڕووی کردە شارو شارۆچکەکانی تر ،بۆ ئەوەی بەتەواوەتی پاك یان بکاتەوە ،کە بگەشتایەتە هەر جێگایەك ئازادی دەکرد بە بەرگرییەکی کەم . صەلاَحە دینی ئەیوبی یەکسەر کەزانی صەلیبی یەکان ئەم هەموو سوپایان کۆکردۆتەوە و ناوچەی عەککا چۆڵ بووە خێرا میناى عەککای گرتە دەست و بەرەو عەککا ڕۆشت ولە جەمادی یەکەمی ٥٨٣کۆچی= ١١٨٧ ز بەڕێککەوتنێك صەلاَحە دین دەستی گرت بەسەر عەککا دا کە ٤ هەزار دیلی موسڵمانی تێدا بوو لەگەڵ ماڵ و سامانێکی زۆر، ە صەلیبی یەکان هەموویان ڕایان کردەوە ناوچەکانی صور ،صور یە کێك بوو لە شارە گەورەکان ، وەنوێژی هەینی یان کرد لە مزگەوتێکدا کە فرەنسییەکان کردبوو یانە کلێسا ،خێرا کەوتنە ڕێکخستنی شارەکە ،وە صەلاَحەدینی ئەیوبی فەرمانی بە مەلیك عادلی برای کرد کە لە میسرەوە هێرش بەرێت بۆ سەر صەلیبی یکان ،ئەوە بوو ملیك عادل یش هێرشی کردوو توانی دەست بگرێت بەسەر هەندێ شوێندا لەوانە (یافا) وە خەڵکێکی زۆری بە دیل گرت ،هەروەها صەلاَحە دین لە کاتی مانەوەی لە عەککا دا دەستی گرت بەسەر چەند شوێنێك دا لەوانە (صفوریە ،صەیدا ، نابلوس ،بیروت و جبیل) .



هەروەها لە دوای چەند ڕۆژێك لە گەمارۆدانی بیروت ئەویشی ئازاد کرد ،بەلاَم لە ڕزگار کردنی جبیل دا مەرجێکی تێدا بوو کە پادشا کەیان ئازاد بکات کە دیل بوو لە دیمەشق ،بەلاَم ناوچەی صورە بە جێهشت و دەستی بەسەر دا نەگرت ،دواتر ڕوو دەکاتە ناوچەی عەسقەلان کە دەکەوێتە نێوان شام ومیسرەوە کە لەگەڵ مەلیك عادلی برای گەمارۆی عەسقەلان یاندا ،پادشاکەی دیل بوو لەلای صەلاَحەدینی ئەیوبی لەگەڵ خۆیان بردیان بۆ ئەوەی داوا لەخەڵکی عەسقەلان بکات خۆیان بدەن بەدەستەوە بەلاَم سوکایەتی یان بە پادشاکەش کرد،وەلەدوای ٤٠ ڕۆژ گەمارۆدانی عەسقەلان فەتحی ئەو ناوچەیەشی کرد ،واتا دەوری بیت المقدیس زۆربەی زۆری ناوچەکانی ئازاد کرد دواتر گەڕایەوە بۆ خوارەوە چووە (رملە ،غەززە،بیت الحم و نغرون ) هەموو ئەم ناوچانەی پاککردەوە لەدەستی صەلیبی یەکان تەنها لەناوەڕاستدا بیت المقدیسی هێشتەوە ،دواتر خەڵکی بەشوێن صەلاَحە دینی ئەیوبی دا شعریان دەوتەوە ،وەخەڵکی زۆر دڵ یان خۆش بوو.

بۆچی سوڵتان صەلاَحە دین دوای شەڕی حطین ڕاستەوخۆ هێرشی نەکردە سەر قودس ؟

یەکەم : ئامانجی لەگرتنی شارە کەنارییەکان پچڕانی پەیوەندی صەلیبی یەکان بوو لەگەڵ ناوچەی سەرەکی یەکان کەڕۆژ ئاوایە واتا ئەوروپا.

دووەم :بۆ ئەوەی بە ئاسانی بتوانێت پەیوەندی بە ناوچەکانی (شام) ەوە بکات لەڕێگای ئاوییەوە بەهەمان شێوە هێزی صەلیبی یەکان نەکەوتە پشتەوەی هێزەکانی صەلاحە دینی ئەیوبی یەوە.

سێیەم : بەلاَم سوڵتان صەلاَحە دینی ئەیوبی تەنها لە گرتنی شاری صور سەرکەوتوو نەبوو بەهۆی شورای شارەکەو سەختی بەوەی کە هەموو لایەکی ئەم شارە بەئاو دەورە دراوە ،دوای تەواو کردنی نەخشە سەربازیەکەی بەرەو ئامانجی سەرەکی کەوتە ڕێ ،ئەویش گەمارۆدانی شاری قودس و دواتریش گرتنی، سەرچاوەکان بەتایبەتی (ئیبنو شداد و قاضی فاضل ) و چەندینی دیکە ئاماژە بەوە دەکەن گرتنی قودس دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سیاسەتەی کە سوڵتان گرتییە بەر بەرامبەر بە صەلیبی یەکان و مەسیحی یەکان و خەڵکانی دیکەی ناوچەکە لە کاتی شەڕەکانی ،هەروەها ئەو ڕێککەوتنەی کە لەگەڵ دانیشتوانی شاری قودس دا ئەنجامی دا



# سەرچاوەکان

## سەرچاوەکان بەکوردی:


١.خولاسەیەکی تەئریخی کورد و کوردستان / امین زەکی بەگ، چاپی نوێ، سلێمانی، ٢٠٠٠، بەرگی دووەم.

٢.خەونی سەربەخۆیی لەواقیعێکی ناجێگیردا : عەتا قەرەداخی، چاپی یەکەم، بەرێوەبەرایەتی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، ٢٠٠٤.

٣.دەزگاکانی بازرگانی و کاڵابازرگانیەکانی میسر لەسەردەمی سەلاحەدینی ئەیوبی دا : پ.ی.د : نەبەز مەجید ئەمین،م. سەلاح کانەبی ئیسماعیل، چاپی یەکەم، چاپخانەی زانست، سلێمانی، ٢٠٠٣.

٤.راگەیاندنی دەرونی لەسەردەمی سەلاحەدینی ئەیوبی دا : پ.ی.د، نەبەز مەجید ئەمین، ئاراس فەریق زەینەل، چاپە یەکەم، چاپخانەی زانست، سلێمانی، ٢٠٠٤.

٥.سەلاحەدینی ئەیوبی ژیاننامەی گەشترین: د. محسین محمد حسین، بەشی مێژوو کۆلێجی پەروەردە (ابن شداد) زانکۆی بەغدا، وەرگێری، عبدالرزاق بیمار، چاپخانەی دار الریه، بغداد، ١٩٩٣.

٦.سەلاحەدینی ئەیوبی : صدیق بۆرەکەی (صفی زاده) تاران، ١٣٥٨.

٧.سەلاحەدینی ئەیوبی کورد لەمیسر: جۆرجی زێدان، وەرگێران لەفارسیەوە، محمد علی شیرازی، و. کوردی، رێباز مستەفا، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٤.

٨.گۆڤار : رۆشنبیری نوێ، ژمارە ١١٨ / حوزەیرانی ساڵی ١٩١٨، د. محسین محمد حسین : چۆنیەتی و هۆکارەکانی پەیوەندی کردنی سەلاحەدین لەگەڵ خەلیفە المنصور الموحدی


## سەرچاوەکان بەعەرەبی:


١.سیره صلاح الدین الآیوبی : القاچی بهاو الدین المعروف بابن شداد، تألیف، تاج الدین شاهنشاه، ابن ایوب، الناشر، دار المنار، القاهره، ٢٠٠٠.

٢. محمد حسن: صلاح الدین فی نڤریە مۆرخیە (فروسیە صلاح الدین)


## پەراوێزەکان

١.صەلاحەدینی ئەیوبی ژیاننامەی گەشترین : د. محسن محمد، بەشی مێژوو کۆلیژی پەروەردە (ابن شداد) زانکۆی بەغدا وەرگێری: عبدالرزاق بێچار، چاپخانەی دار الحریە، بغداد، ١٩٩٣، لـ٧.

٢.خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان: محمد أمین زەکی، بەرگی دووەم، چاپی نوێ، سلێمانی، ٢٠٠٠، لـ٧٣.

٣.صەلاحەدینی ئەیوبی: صدیق بۆرەکەیی (حسنی زادە)، تاران، ١٣٥٨، لـ١١.

٤..خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان: محمد أمین زەکی، بەرگی دووەم، چاپی نوێ، سلێمانی، ٢٠٠٠، لـ٧٣.

٥..صەلاحەدینی ئەیوبی ژیاننامەی گەشترین : د. محسن محمد، بەشی مێژوو کۆلیژی پەروەردە (ابن شداد) زانکۆی بەغدا وەرگێری: عبدالرزاق بێچار، چاپخانەی دار الحریە، بغداد، ١٩٩٣، لـ٦.

٦. صەلاحەدینی ئەیوبی: صدیق بۆرەکەیی (صفی زادە)، تاران، ١٣٥٨، لـ١١..

٧. صەلاحەدینی ئەیوبی ژیاننامەی گەشترین : د. محسن محمد، بەشی مێژوو کۆلیژی پەروەردە (ابن شداد) زانکۆی

٨.سیره صلاح الدین ایوبی: القاچی بهاالدین المعروف باین شداد، تألیف، تاج الدین شاهنشاه، ابن أیوب، القاهره،،٢٠٠٠، لـ٩.

٩.سیره صلاح الدین ایوبی: القاچی بهاالدین المعروف باین شداد، تألیف، تاج الدین شاهنشاه، ابن أیوب، الناشر دار المنار، القاهره،،٢٠٠٠، لـ٤٩.

١٠. راگەیاندنی دەروونی لەسەردەمی صەلاحەدینی ئەیوبیدا پ.ی. د.نەبەز مجید امین، ئاراس فەریق زەینەڵ، چاپی یەکەم، چاپخانەی زانست، سلێمانی، ٢٠٠٤، لـ١٣.